بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ناميلكەی شيعری ئاينی



( (( ألله )) بناسه .... (( جَلَّ جَلاَلُهُ )) )

( باوكی سەروەر )

١٤٣٦كۆچی – ٢٠١٥زايينی

## (( أَللّه )) بناسه ... (( جَلَّ جَلاَلُهُ ))

زاتی (( أَللّه )) یه ' خـودای میهرەبان
خودای بونەوەر ' خـــوای زەوی و ئاسمان

بەدیهێنەری کـەون (( أَللّه )) یـــە
(( واجبُ الْوُجُود )) هەر خۆی تەنهایە

خـۆی بـێ شەریـکە لـەم بوونـەوەرە
نـــور لەسەر نـورە هەم منـەوەرە

گەورەتـرین مـوعجیزەی ئـەو خـوایە
(( قورئـانە )) وا لەبەر دەستـمانـدایە

دەریـا و وشکـانی ' زورگ و چیـاکـان
دەشـت و بیـابـان ' گرد و بانەکان

شەو و ڕۆژ و خۆر ' مانگ و هەســارە
دروسـتی کـردون بـێ شـك دیـــارە

هەر خوی ((رَحمٰن)) ە، لەگەڵ ((الرَّحیم))
زۆر بەزەیی یە بەخشندە و کەریم

رێی موستەقیمی ڕاست و دروستە
گەر بیپەرستی گشت جەستەت چوستە

((مرۆڤ)) و ((جِنّ)) ی لەسەر ئەرز دانا
گشت پەریەکانیش وا لە ئاسمانا

تەنها ڕۆژێکمان لای خوای بەخشندە
ڕێک هەزار ساڵە لای ئێمەی بەندە

هەر ئەویش پێکەنین و گریانی
بەخشیوەتە سەرجەم بەندەکانی

دەبێ بزانین خوا لەگەڵمانە
ئەگەر تەنیا بووین ئەو دوهەمانە

بێگومان ئاگای لە گشت شتێکە
هەر (( الله )) بۆ خۆی هەموو شتێکە

لە زانستی کۆن ئینجا نوێیەکەی
بیست و چوار سەعات ڕۆژ و شەوەکەی

لە بونەوەر هەرشتێ ڕووبدات
ئاگای لێیەتی دەقیقە و سەعات

بەکەلیمەی (( كُنْ )) ئەگەر بیەوێ
گشت شتێ دەکا هەر چۆنی بوێ

هەرچی ڕوودراوە لای موقەددەرە
هیچ دوا ناکەوێ خۆی دەست پێشخەرە

بەچرکە و سەعات پێ ی ئاگادارە
کە وادەشی هات ڕۆح دەستبەردارە

هــەر لــە ((ئەزەل)) ڕا تــاكو قیامەت
خۆی پێی ((عالیم))ە لە هەموو بابەت

نــە خەوی هــایــە نــە نــان و خواردن
بــوونــی هــەر بووە و نیــەتی مــردن

هــەرگیــز پێویستی بــەهیچ شت نیــە
خــۆی پــاشای عــەرشە، مــەسیلی نیــە

گــەلێ گــەورەیــە دورە لـــە عــــەیب
هەر خۆی دەزانێ سەرجەم عیلمی غەیب

هــەر چیــەك دــەیە لــەئاسمان، زەوی
لــە ڕاســت و چــەپ و بــلــند و نــەوی

گــەورە و بچــوكــی ی گشــت هــەسارەكان
لــە ووردە گــەرایــلــە هەستیــارەكـــــان

هـەوا و هـەنـاسـە و دڵـۆپـەی بـاران
هێنـاویـە وجـود خـودای ئیـهـرەبـان

کەس بەقەد (( الله )) دەوڵەمەند نیە
شـوێنێکی دیـاریـکراویـشـی نیــــە

لـە گشـت شوێنێکە خـودای بالاَ دەست
نـاوەکانیشی پڕ مـانـا و مـەبـەسـت

لـەگەڵ بـەندەکـانی سەرجەم هـەموو
هـەردەم مـەوجودە بـەبێ یـەك و دوو

ڕۆزی و نیعمـەتـی لـەسـەر ئەم زەویـە
نـایـەنـە هـەژمار ' کـەمی بـۆ نیـە

بـۆ گیـانلەبەر و سـەرجـەم زینـدەوەر
هـەر خـۆی بەخشەرە لە نێر بوونـەوەر

بەهار و هاوین پاییز و زستان
یەك لە دوای یەكی داناوە یەزدان

هەورە بروسكە و گەوارەی بەهار
لەگەڵ فڕینی گشت مەلی باڵدار

دەیانبزوێنێ لە فەزای ئاسمان
زۆریان بەسوان بۆ ئێمە ومانان

بەهەشت و دۆزەخ لە ژێر عەرشی خۆی
بۆ بەندەكانی داینـاوە لای خـۆی

(( نەفخی صُور )) لێدان بەنەمری ئەوە
زیندووكردنەوە و هاتنە دەرەوە

وێران بوونی ئەم كەونە و دونیایە
تەنها لە زانستی یەزدان دایە

ناوە پیرۆزەکانی خوای غەفور
لە (( اللّه )) وە تاکو ناوی (( صَبُور ))

سەرجەمیان (( سەد )) ن یەکی لێدەرکە
گەر خۆشت دەوێن هەمووی ئەزبەرکە

هەر لە ڕۆژئاوا تاکو ڕۆژهەلآت
ئەوپەڕی قووەت ، خاوەن دەسەلآت

لە بیدایەتدا تاکو ئیهایەت
حیسابی دوایی و ڕۆژی آخیرەت

ئەوەی بێ روحە و ئەوەی گیانلەبەر
خوا خاوەنێتی (( اللّه أکبَر ))

٢ / ٣ / ٢٠١٥
هەولێر/ بەهاری نوێ

: